# 50

# خراپەی ڕوون و ئاشکرا
# لە دیموکراتی و هەڵبژاردندا

ئامادەکردنی : باوکی خوبەیب

پەرلەمانی کوردستان ـ عێراق

برلمان كوردستان ـ العراق

Kurdistan Parliament - Iraq

# ٥٠ خراپەی ڕوون و ئاشکرا لە دیموکراتی و هەڵبژاردندا

## ئامادەکردنی: باوکی خوبەیب

بسم اللَّه الرحمن الرحيم

الحمدللَّه الذي جعل الإسلام أرقى النظم، وأعلاها، وجعل أهله هم أعز الأمم وأشرفها، وأزكاها، أحمده سبحانه على أحكامه، وأقواله، وأفعاله، التي بلغت في الحكمة، والمصلحة غايتها، ومنتهاها، وأشكره على نعمه أُولاها، ووسطاها، وأُخراها. وأشهد أن لا إله إلا اللَّه، وحده لا شريك له، ولا ند له، ولا يماثَل، ولا يُضاهي فعزّ رباً، وجلّ ملكاً، وتعالى إلهاً.

وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ الإِسْلاَمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ

١) دیموکراتی وەك پەیڕەو مەنهەج و, هەڵبژاردن وەك ئالیەتی جێبەجێ کردنی، ڕێگا و بەرنامەیەکی سەربەخۆی نەفامی وجاهیلییە و, پێچەوانە و دژ بە پەیام و مەنهەجی ئیسلام دەوەستێتەوە، هەر بۆیە بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ ئیسلامدا یەك ناگرن و پێکنایەنەوە، چونکە ئیسلامی ڕوناکی خوایی و دیموکراتی تاریکی ڕێچکەکان هەرگیز

یەکسان نابن (ومَا يَسْتَوِي الْأَعْمَى وَالْبَصِيرُ * وَلَا الظُّلُمَاتُ وَلَا النُّورُ) الفاطر:٢٠ یانی: نابیناو بینا وەك یەك نین واتە مرۆڤی بروادارو بێ بروا وەك یەك نین, وە نەتاریکیەکان ونەروناکایش واتە ئیمان و گومڕاییەکان وەك یەك نین).

٢) وە ئیسلام هیدایەتی خواییە بەڵام دیموکراتی گومڕایی و چەواشەکارییە .

(قَدْ تَبَينَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ) یانی: بێگومان ڕێگای هیدایەت وڕاستی لە گومڕایی جیابۆتەوە.

و هەر ئیسلام مەنهەج و پەیامی ئاسمانی خواییە، بەڵام دیموکراتی زادەو بەری بیری ئادەمیە، بێگومان ئەمەش جیاوازی و جوداییەکی گەورەیە لە نێوانیاندا.

٣) چونە نێو گەمەی دیموکراتی لە خۆیدا وابەستە بون وگوێڕایەڵیە بۆ بێ باوەڕان لە گاور و جولەکەکان، لە کاتێکدا فەرمانمان لە لایەن خواوە بە گوێڕایەڵی نەکردنیان و پێچەوانە بوونیان پێکراوە، (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا إِنْ تُطِيعُوا فَرِيقًا مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ يَرُدُّوكُمْ بَعْدَ إِيمَانِكُمْ كَافِرِينَ) آل عمران, یانی: ئەی ئیمانداران ئەگە ئێوە گوێڕایەڵی

له دەستەیەکی دڵرقنی خاوەن نامەکان بکەن ئەوا کافرتان دەکەن وله دینی ئیسلام لاتان دەدەن.
وه دەفەرموێت: (فلا تُطعِ الْكَافرينَ وَجَاهِدْهُمْ بِهِ جِهَادًا كَبِيرًا) یانی: هەرگیز گوێڕایەڵی بێ باوەڕان مەکە, وه بە قورئان بە هەموو هێزو و توانایەکت جیهاد و ململانێیەکی سەختیان بکە.
وه دەفەرموێت: (وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ وَدَعْ أَذَاهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ وَكِيلًا ) الأحزاب:٤٨ یانی: گوێڕایەڵی کافرو مونافقین مەکە گوێ مەدەرە ئەو ئەزیەت و ئازارەی پێشت دێنن وەپشت بە خواقایم بێت و تەنها خوا بەسە چاودێرو یاریدەدەرت بێت. وه ئایەتەکانی قورئان بەم واتایە زۆر و ئاشکرایە.
٤) دیموکراتی ئاین و دەوڵەت لە یەکتر جیادەکاتەوە، لە میانەی کەنارخستنی شەرع و پەیامی خوا لە بەڕێوەبردنی ژیانی خەڵکی و، مافی یاسادانان و تەشریع دانە دەست گەل واتە گەل حوکمی خۆی بکات و حوکمی خوا پەك بخەن بە بەهانەی پیادە کردنی مافی دیموکراتی خۆی ـوەك دەڵێن ـ لە ڕێگەی سندوقەکانی هەڵبژاردن یان لە ڕێگەی نوێنەرانی لە ئەنجومەنی نوێنەران.

٥) دیموکراتی دەرگا ئاوەڵا دەکات بەڕوی پاشگەزبونەوە و زەندیقی لە دین (الردة والزندقه)، بە جۆریك لە ژێر سایەی ئەم ڕژێمە تاغوتیەدا ڕێگە دەدرێت بە خاوەنی هەر پەیڕەو و ئایدیایەك پارت پێك بهێنێت و گۆڤار و ڕۆژنامە دەر بکات و بە ئازادانە بانگەشەی خەڵکی بکات بۆ دەرچون و لا ڕێی لە دینی هەقی ئیسلام...

ئەمەش با بەهانەی بوار دان بە ڕاو ڕای جیاواز، ئیدی لە پاش ئەمە چۆن دەگوترێت:- (دیموکراتی لەگەڵ شورا و ڕاوێژکاریدا پێکدێنەوە!!) یان (دیوکراتی تایبەتمەندیەکە موسوڵمانان زیاد لە هەزار ساڵە لە دەستیان داوە !! )، وەك هەندێ عەوام و نەفام بە دین ئاماژەی پێدەکەن، بەڵکو هەندێ گروپی ئیسلامی لە بەیانامەکانیاندا ڕاشکاوانە دەڵێن (بە دڵنیاییەوە دیموکراتی و فرە حیزبی تاکە ڕێگای شیاوە کە ئێمە بەرێیەوە وڵات بەرەو باشتر و چاکتر بەرین!!) ئەمەش بە بەرزکردنەوەی دروشمی (خزمەتگوزاری و چاکسازی) .

٦) دیموکراتی دەرگا ئاوەڵا دەکات بەڕوی ئارەزوو بازی و بەرەڵایدا، لە مەی خۆری و، بێ ڕەوشتی و فاحیشە گەری و داوێن پیسی و، گۆرانی و یانەی سینەما و،نادی وباڕەکان و ... چەندین ڕێگە و هۆکاری تر بۆ شکاندنی سنورە قەدەغەکراوەکانی خوای گەورە، ئەمەش لە ژێر دروشمی باوی دیموکراتیدا کەدەڵێت: وازی لێبێنە چی ئارەزوی دەکات با بیکات ، وە بە چ ڕێگەیەکدا دەڕوات با بڕوات) وە لە دروشمی: ( پاراستنی ئازادی تاك). واتە ئازادی بۆ هەموو شتێك.

٧) وە دیسان دەرگا ئاوەڵا دەکات بۆ ناکۆکی و جیاخوازی و پەرتەوازەی، ئەمەش لە خۆیدا وەڵامدانەوەی پلانی داگیرکەرانە بە ئامانجی پەرتەوازە کردنی جیهانی ئیسلامی بۆ چەند نەتەوەو و نیشتمان و هەرێمێکی جیاواز وناتەبا.

وە بۆ فرە حیزبی و دەمارگیری، دیارە ئەمەش سەرپێچی کردنی ئاشکرای فرمانی خوایە کە دەفەرموێ: (إِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّه وَاحِدَه وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاعْبُدُونِ) یانی: بەڕاستی ئا ئەمەیە ئوممەت و هاوبیر و هاوڕێبازانی ئێوە منیش پەروەردکارتانم تەنها هەر من بپەرستن.

وه فەرمانی (وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُوا إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ) الأنفال:(٤٦) یانی: وه جیاواز ودووبەرەك مەبن هەتاوەك بەهۆیەوە بشكێن ولاوازبن ,وه هێز و تواناتان نەمێنێت.

٨) ئەوەی ڕێگای دیموكراتی بگرێتە بەر یان پەیڕەوی بكات، دەبێت بێ لاملی دان بە سەرجەم دەزگا و ڕێكخراوە كوفریەكان بنێت و, بنەماكانیان پەسەند و پەیڕەو بكات، وەك (نەتەوە یەكگرتوەكان) و (یاساكانی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی) و (قانونی ئەحزاب) و (جاڕنامەی مافی مرۆڤ) و جگە لەمانە ئەو یاسا و بەندانەی پێچەوانە لەگەڵ شەرعی خوا دەوەستنەوە.

گەر وانەبێت _واتە بەمانە قایل نەبیت_ ڕێگە لە كارو چالاكی حیزبی دەگیرێت بە بەهانەی توندڕەوی و تیرۆر و باوەڕ نەبون بە پێكەوە ژیان و ئاشتی جیهانی...!!

٩) لە ڕژێمی دیموكراتی دا پاشگەزبووان لە دین و دووڕووان (المرتدون و المنافقون) بەهێزی نیشتمان پەروەر و,خەڵكی چاكەكارو دڵسۆز ناو زەد دەكرێن، بەڵام ئاشكرایە لە شەرعی خوادا بە پێچەوانەوەن.

١٠) ڕژێمی دیموکراتی حوکم و فرمانه سەرەکیەکانی شەرع لە کار دەخات، وەك جیهاد و فەرمان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە و ڕژێمی حەیسبە و حوکمەکانی پاشگەزبونەوەو پاشگەزبوان و جیزیە و چەندین حوکمی دییکەی شەرعی خوای گەورە.

١١) دیموکراتی و هەڵبژاردن پشت بە قەرەبالغی و زۆرینە دەبەستێت، بێ بەهەند وەرگرتنی بنەما و پێوەرە شەرعیەکان، خوای گەورەش دەفەرموێت: (وَإِنْ تُطِعْ أَكْثَرَ مَنْ فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ) الانعامَ (١١٦), یانی: ئەگەر تۆ گوێڕایەڵی زۆرینەی ئەوانەی سەرزەوی بیت لەڕێگەی خوا گومران ئەکەن, ئەوان هەر شوێنی گومان کەوتون وە هەمیشە درۆ و گۆترەکاریدەکەن.

وە دەفەرموێت: (وَلكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لا يعلمُونَ) یانی: بەڵام زۆرینەی خەڵکی نەفام و نازانن.

وە دەفەرموێت: (وَقَلِيلٌ مِنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ) یانی: کەمینەیەك لە بەندەکانم سوپاسگوزارن بۆ ئەو نیعمەتانەی داومانێ.

١٢) ڕێگای دیموکراتی هۆکارێکه بۆ بێ ئاگابون غافڵبون له سروشتی صیراع و ناکۆکی نێوان ئیسلام و جاهیلیەت و هەق و ناڕەوا (الحق وباطل) له کاتێکدا بوونی هەرکامیان مانای لەناوچون و نەمانی ئەوی تریان دەگەیەنێت ،بۆیە هەرگیز پێکەوە کۆنابنەوەو، ئەوەشی وا گومان دەبات که دەکرێت له ڕێگەی سندوقەکانی دەنگدانەوە جاهیلیەتی سەردەم خۆی بە تەواوی بە دەستەوە دەدات, ئەوە بێگومان پێچەوانەی عەقڵ و دەقەکانی قورئان و فەرمودە وەستاوەتەوە وە دە دیسانە وە پێچەوانەی ئەو سونەتە گەردوونییە کە ئادەمیزادەکان لەسەری ڕۆیشتون (وَلنْ تَجِدَ لِسُنَّه اللَّهِ تَبْدِيلا) , (وَلنْ تَجِدَ لِسُنَّه اللَّهِ تَحْوِيلًا) یانی: هەرگیز رێساو بەرنامەکانی خوا گۆڕانکاری بەسەردا نایەت و لەنەخشەی خۆی لانادا.

١٣) ڕێگەی دیموکراتی دەبێتە مایەی سڕینەوە و پوکاندنەوەی بنەماکانی ئەو بیر و باوەڕە ڕاست و دروستەی که پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵە بەڕێزەکان لەسەری بوون. وە بڵاوبوونەوەی داهێنراوەکان (البدع) ە وە مایەی نەخوێندنەوە و بڵاونەکردنەوەی ئەو بیروباوەڕە ڕاست و کامڵە یە له نێوخەڵکیدا، چونکە مانا و مەفهومەکانی دەبنە

مایەی دەستبەرداری و تۆراندنی خەڵکی لە حیزب, ئەمەش ڕێژەی دەنگ و دەنگدەران کەم دەکاتەوە .

١٤) دیموکراتی جیاوازی ناکات لە نیوان زاناو نەزان و کافر و موسوڵمان و نێر و مێ هەمووان لە دەنگداندا یەکسانن، بە بێ هیچ کێش ئەرزشێك بۆ تایبەتمەندیە شەرعیەکان، وە خوای باڵادەست دەفە رموێت: (قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ ) الزمر(٩) واتە: بڵێ ئایا ئەوانەی زانان یەکسانن لەگەڵ ئەوانەی نەزانن ,بە ڕاستی تەنها ژیر و هۆشیاران هەست بم ڕاستییە دەکە.

وە دەفەرموێت: (أَفَمَنْ كَانَ مُؤْمِنًا كَمَنْ كَانَ فَاسِقًا لا يسْتَوُونَ) یانی: ئایا ئەو کەسەی ئیماندارە وەك ئەوکەسەی کە تاوانبارو بێ دیین؟ بێگومان هەرگیز وەکو یەك نین .

وە دەفەرموێت: (أَفَنَجْعَلُ الْمُسْلِمِينَ كَالْمُجْرِمِينَ) یانی: چۆن ئێمە موسوڵمان و بەدکاران وەك یەك لێدەکین.

وە دەفەرموێت: (وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالأنْثَى) یانی: بەڕاستی نێرینە وەك مێینە نییە.

١٥) ئەم ڕێگەیە هۆکارە بۆ بوون و سەرهەڵدانی ناکۆکی نێوان بانگخوازانی ڕێگە ی خواو پارتە ئیسلامیەکان ، چونکە گرتنەبەری ئەم ڕێگە لە لایەن هەندێکیانەوە بەرەو ئەوەیان دەبات کە خۆیان بە خاوەنی بکەن و بەرگری لێ بکەن، وە ڕواڵەت و سومعەی لای خەڵکی جوان بکەن و، بەشدار بن لە پێکهێنان و باڵا دەستبونی ڕژێمەکەی, پاشان دژایەتی کردنی ئەوانەی دژی ڕادەوەستین و، دۆستایەتیکردنی دۆست و هەوادارانی، ئیدی فەتواکان لەو بارەیەوە پێکدادەدرێن لە نیوان دروستی و نادروستی و مەدح کردن و زەم کردنیدا .

١٦) لە سایەی ڕژێمی دیموکراتیدا مەسەلەی دۆستایەتی و دوژمنایەتی (الولاء والبراء) بەنادیاری و لێڵی دەمێنێتەوە، بۆیە دەبینین هەندێك لەوانەی پەیڕەو لەم ڕێبازە دەکەن ڕاشکاوانە دەڵێن کە جیاوازیان لەگەڵ شیوعیەکان و بەعسیەکان و غەیری ئەوان لە پارتە عەلمانیەکان لە ڕوی پلان و بەرنامەی کارە نەك مەنهەج و پەیڕەو وە لە هاو شێوەی جیاوازی چوار ڕێرەوە کەیە (المذاهب الأربعة) بۆیە پەیمان و هاوپەیمانیەتی لە گەڵیان دەبەستن هەتا کەسیان یەکدی بە کافر

نەزانن و, خیانەت لە یەکدی نەکەن, یان بە خیانەت یەکدی تۆمەتبار نەکەن، هەر بۆیە دەڵێت (جیاوازیمان کار لە دۆستی و نزیکیمان ناکات).

١٧) چونە نێو گاڵتە جاڕی دیموکراتی زۆرکات سەر دەکێشێت بۆ خراپی و گۆڕانی ئامانج و نیازەکان، بە جۆرێك هەر پارتەو و هەوڵو کۆششی لەپێناو سەرخستنی پارتەکەی خۆیەتی، وە هەموو هۆکارەکان بە کاردێنێت بۆ راکێشان و گردکردنەوەی خەڵکی لە دەوری، بە تایبەت ڕێگەی دینداری و وتاردان و ئامۆژگاری و فێرکاری و هاوەڵایەتی و هۆکارەکانی دی .

١٨) دیموکراتی هۆکاری تێکدان و لە بەین بردنی ئاکارو ڕەوشتە باڵاو جوانەکانە، وە ڕاستگۆی و وەفاداری و ڕاشکاوی...

لە بەرامبەردا هەریەك لە سیفەتە قێزەونەکانی خیانەت و درۆ و پاساو هێنانەوەی نادروست شوێنیان دەگرنەوە.

١٩) دیسان هۆکاری دروستبونی لوت بەرزی و لە خۆبای بون و بەکەم زانینی خەڵکیە وە سەرسامی و موعجەببونی هەر کەسە بە ڕاو بۆچونی خۆی، چونکە مەسەلەکە هەموو ڕاو بۆچونە، وە خوای گەورە

فەرمویەتی (كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ) یانی: هەر كۆمەڵ و دەستیەكیان دڵخۆشن بەوەی لە لایانە .

٢٠) قایل بوون و ڕازی بوون بە دیموكراتی – گەر بە دیقەتەوە لێی حاڵی بین – تانەو سوكایەتییە بە پێغەمبەران (علیهم السلام) و پەیامە ئاسمانیەكان، چونكە گەر هەق لە ڕێگەی زۆرینەوە بناسرێت و پەی پێ ببرێت ئیدی هیچ مانایەك نییە لە ناردنی پێغەمبەران(علیهم السلام) و نازڵكردنی پەراوەئاسمانییەكان، وە هەمیشە پێغەمبەران (علیهم السلام) كە ڕەوانەكراون بە ئاڕاستەی جیاوازی زۆرینە و ئەوەی خەڵكی لەسەری بوون _لە گومڕای و بیرو باوەڕی بەتاڵ و باو نەریتی جاهیلی_ بانگەوازیان كردوە و كاریان ئەنجامداوە.

(٢١) دیموكراتی دەرگا دەكاتەوە بە ڕوی گومان و شوبوهات و هەژاندنی بیروباوەڕی موسوڵمانان، بە تایبەت ئێمە كەلە سەردەمی كەمبونەوەی زانایانی خواویست و بڵاوبونەوەی نەفامیدا دەژین، كە زۆربەی خەڵكی بە هۆی كەمی عیلم و سادەی تێگەیشتنیان – هەندێ جار توشی شكستی نەفسی و دڵەڕاوكێی دەبن, لە بەرامبەر هەموو ئەو شەپۆلەماڵەرانەی ڕوبەروویان دەبێتەوە لە لایەن پارت و ڕۆژنامە و

گۆڤارەکان و, ڕاو بۆچونە شازو چەوتە کانەوە. خوا پێ چەسپاو پارێزراومان کات.

٢٢) بێگومان بنەمای ڕژێمی دیموکراتی لە بنەڕەتدا ڕاوەستاوە لەسەر گوێنەدان و قایل نەبوون بە دادوەری (الحاكمية) ی خوا، ئەمەش لە میانەی کار و مافی ئەنجومەنەکانی نوێنەرایەتی، وە بەشداریکردن لە پروسەی دیوکراتی بە پاساوی گەیاندنی بەڵگەکانی قورئان و فەرمودە لەو مینبەرەوە لەکاتێکدا قورئان و فەرموودە لای ئەوان بە بەڵگە دانانرێت وحیسابیان بۆ ناکریت _بەڵگە لەو جێگەو لای ئەوانەی لەو جێیە کۆبونەتەوە بریاری زۆرینەیە_ ئیدی بەڵگە چۆن بە شتێك دێتەوە کە حیسابی بەڵگەی بۆ ناکرێت، چەندە بەڵگەی شەرعی بخەیتە ڕوو وە بەسەریاندا بخوێنیتەوە بە دیدی ئەوان تەنها بۆچون و ڕایەکەو هیچیدی، وە هیچ پیرۆزییەکی نییە، چونکە ئەوانە دەیانەوێت، وەك دەڵێن: (لە بڕیار و حوکمە غەیبیەکان دەرباز بن کە سەرچاوەی لە گەلەوە نەگرتووە) بەمەیش تەنها مەبەستیان حوکمی خواو پێغەمبەرەکەیەتی (ﷺ) وە داننان قایل بوونی تۆ بەم پەیرەوە و ڕێکردن لەگەڵی ئەو بنەمایە هەڵدەوەشێنێتەوە کە دەبێت بڕیار و

حوکمی ڕەها هەر بۆ خوا بێت، وە هەرکات پێکهاتن لەسەر ئەوەی بڕیاری زۆرینە بەڵگەی یەکلاکەرەوەی جیاوازیەکان بێت، ئیدی ئەو کات خوێندنەوەی قورئان و فەرمودە هیچ مانا و بایەخێکی نابێت چونکە لای ئەوان بە بەڵگەی پەسەندکراو دانانرێن.
٢٣) بەو بانگخوازانەی بەم ڕێگە فریویان خواردوە دەگوترێت: ئایا گەر گەیشتنە دەسەڵات بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی دیموکراتی دەدەن، یان ڕێگر دەبن لەبەردەم دروست بون یان مانەوەی پارتە عەلمانیەکان، لە کاتێکدا ئێوە پێشتر لەگەڵ ئەو پارتانەدا ڕێککەوتون بە پێی (یاسای حیزبەکان) کە ڕژێمی حوکوم لە وڵاتدا دەبێت دیموکراتی بێت و، ڕێگە بە سەرجەم پارتەکان بدرێت و هاوبەشبن لە کایەی سیاسیدا.
گەر ووتتان، بەڵێ دیموکراتی ڕەد دەکەینەوە و ڕێگە لە دروستبونی پارتی عەلمانی دەگرین، دیارە ئەو کارەتان بە شکاندنی ئەو پەیمان ڕێککەوتنە _لەگەڵ ناڕەوایی دا_ دادەنرێت لە لایەن ئێوەوە خوای گەورەش دەفەرموێت: (وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِنْ قَوْمٍ خِيَانَةً فَانْبِذْ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْخَائِنِينَ ) الانفال: (٥٨) یانی: ئەگەر ترسی ناپاکی و شکاندنی پەیمانت کرد لەلایەن دەستەیەك لەوانەوە تۆلەلایەن

خۆتەوە لەبایەخ نەمانی پەیمانەکە ئاگادارین بکەرەوە چونکە خواکەسانی پەیمان شکێن و ناپاکی خۆش ناوێت. وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (ینصب لکل غادر لواء یوم القیامة) واتە: لەرۆژی دوایدا بەیداخ بۆ هەریەك لەوانە هەڵدەکرێت کەپەیمان شکێن و ناپاکییان کردوو .وە فەرمودەی (الحرب خدعة) جەنگ فریودانە، ناکرێتە بەڵگە و نابێتە پاسا و بەهانە بۆ ئەو کارەتان. .

٢٤) دیموکراتی دژ و پێچەوانەی بنەماکانی گۆڕانکارییە لە ئیسلامدا، کە ڕادەوەستێت لەسەر بنەمای ڕیشەکێشکردنی نەفامی (الجاهلیة) بە هەموو بوار و رەهەندەکانیەوە, وە چاکسازی و پاککردنەوەی دەرونەکان وپەروەردەکردنیان لەپێشینەی هەموو چاکسازییەکانەوەیە, وە (إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ) یانی: بە ڕاستی خوا باروو حاڵی هیچ گەلێك ناگۆڕێت هەتا ئەوان باروو حاڵی خۆیان نەگۆڕن.

وە هەروەها چاکسازی لە بوارەکانی دیکەی ئابوری و سیاسی و کۆمەڵایەتی... لە پاش چاکسازی دەرونەکان دێن، وە پابەندن پێیەوە، نەك بە پێچەوانەوە.

٢٥) دیموكراتی دژ و پێچەوانەی ئەو دەقە چەسپاوانەیە كە حوكمی بە حەرامی خۆ چواندن (التشبیه) بە بێ باوەڕان داوە، لە ڕەوشت و ڕێباز و نەریت و مەنهەجیان .

٢٦) ئەم ڕێگایە سەر دەكێشێت بۆ بستنی بە هاوپەیمانیەتی و گوماناوی لەگەڵ پارتە عەلمانیەكاندا، وەك ئەوی ئەمڕۆ دەیبینین ؟!!.

٢٧) لە ترسناكترین شوێنەواری پەیڕەوی دیموكراتی و هەڵبژاردن ئەوەیە كە ڕێگەی سەپاندنی دەسەڵات وسەركرداری كردنی بێ باوەڕ و مونافیقانە بەسەر موسوڵماناندا، بەو ڕێگەی كە هەندێ نەفام بە دین بە شەرعی دەزانن، وە خوای گەورە دەفەرموێت: (لا ينَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ ) یانی: پەیام و پەیمانی من نادرێ بە زاڵم و ستەمكاران.

وە دەفەرموێت: (وَلنْ يجْعَل اللَّهُ لِلْكَافِرينَ عَلى الْمُؤْمِنِينَ سَبِيلا) واتە: هەرگیز خوا نایەڵێت كافران دەستڕۆیشتوبن بەسەر ئیمانداراندا. چەندە خەڵكی عەوامی موسوڵمان بەم چەواشەكاریە فریودراون و لە خشتە براون و وا حاڵی كراون كە ڕێگەی هەڵبژاردن لە پێناوی خزمەتی خەڵك و بانگەوازی ئیسلامیدا شەرعییە!!!

٢٨) دیموکراتی مەفهومی ڕاست بۆ (شوری) هەڵدەوەشێنێتەوە و لە واتای ڕاستی خۆی لایدەدات .
چونکە شورا بە لای کەمەوە لە سێ خاڵی سەرەکی دا دژو پێچەوانەی دیموکراتی دەوەستێتەوە :
یەکەم / حوکم و بڕیار لە شورادا بۆ زاتی پاکی (الله) یە (إن الحکم إلا لله) لە دیموکراتیدا بە پێچەوانەوە حوکم و بڕیار بۆ گەلە.
دووەم/ شوری لە ئیسلامدا لەمەڕ ئەو بابەتانەیە کە جێگەی ڕاوێژ و ئیجتیهادن و زانایان لەسەری یەك دەنگ نەبوون، بەڵام لە دیموکراتیدا بە پێچەوانەوەیە.
سێیەم/ ڕاوێژو شورا لە ئیسلامدا بۆ ئەهلی بڕیار و پسپۆڕ و (حل و عقد) ە، بەڵام لە دیموکراتی دا وەك باسمانکرد وانیە.
٢٩) گرتنەبەری ڕێگەی دیموکراتی هۆکارێکە بۆ بێ باوەڕی و دژایەتی و سوکایەتی بەشەرعی خواو گاڵتە جاری بە هەڵگران و شوێنکەوتوانی، چونکە هەرکات پێیان گوترا بۆیان ڕونکرایەوە کە ئەو حوکم ویاسایانەی بریاریان لەسەر داوە پێچەوانەی شەرعی خوایە،

ئیدی دەکەونە گاڵتە و سوکایەتی بە شەرعی خواو بانگخواز و هەڵگرانی.
هەر بۆیە داخستنی دەرگای شەڕ و خراپە (سد الذرائع) لەم ڕووەوە بە پێویست و خوازراوە دادەنرێت، خوای گەورە دەفەرموێت: (فَذَكِّرْ إِنْ نَفَعَتِ الذِّكْرَى) یانی: ئامۆژگاری بکە گەر ئامۆژگاری سودی گەیاند .
و دەفەرموێت: (وَلَا تَسُبُّوا الَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ فَيَسُبُّوا اللَّهَ عَدْوًا بِغَيرِ عِلْمٍ). یانی: جنێو و قسەی ناشیرین مەڵێن بەوپەرستراوانەی ئەوان هاواریان لێدەکەن و دەیان پەرستن جگە لە خوا بەو هۆیەوە ئەوانیش قسەی نەشیاو بڵێن بەخوا .
٣٠) دیسانەوە مایەی ئاشکرابونی مەلەفی بزوتنەوە ئیسلامیەکان و، دەرکەوتنی ئاستی کاریگەریانە لەسەر خەڵکی، پاشان خستنە گەڕی هەوڵەکان بۆ لە بەینبردن و پەکخستنیان لە لانکە و سەرەتای کاریانەوە .
٣١) پرۆسەی دیموکراتی هۆکارێکە بۆ ئەوەی پارت و جولانەوە ئیسلامیەکان لە لایەن خەڵکانی ناشایستە و نەشیاوەوە سەرکردایەتی و

پێشەوایەتی بکرێن، بە گوێرەی ئەنجامی هەڵبژاردنەکان نە ئاست و پێوەرە شەرعییەکان!!ئەمەش بە زیانێکی گەورە و ترسناك دادەنرێت.

٣٢) بەگەڕان و خوێندنەوەی گشتی، بێ هودەی و بێ ئاکامی و پەککەوتەی ئەم ڕێگەمان بۆ دەردەکەوێت، کە دەبینین زۆرێك لە بانگخوازان لە زۆرێك لە وڵاتاندا بەشداریان لەم سیناریۆ و مەسرەحییەدا کردووە وەك :(میصر و جەزائیر و تونس و ئوردن و عێراق ...هتد) وە سەرەنجامەکەشیان ئاشکرایە لای هەموان، خەون و گومان و خەیاڵ پڵاوی .... ئیدی تاکەی پەند وەرنەگرتن و ڕازی بون بە فێڵ و خەڵەتاندن.

٣٣) هەروەها ئەوانەی سەرنج ئەدەن و تێرا ئەمێنن بۆیان دەرکەوتووە کە ئەم ڕێگایە دەبێتەمایەی تواندنەوە و لە خۆگرتن(الأحتواء) و لاڕێکردنی ڕابونی ئیسلامی، وەدیسان وێڵکردنی لە کارو ئەرکە سەرەکییەکانی، کە گۆڕانی ڕیشەی و هەمەلایەنەیە لە واقیعدا بۆسەرقاڵکردن وئاوڕدانەوە ی بە لای خەون و خەیاڵاتدا.

٣٤) نەهێشتنی پلە و پایەی زانست و زانایان لە نێو کۆمەڵگەدا، کە بێگومان زانایان هەڵگری مەشخەڵی ڕێگان و هەڵدەستن بە واجبی فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە، هەتاوەك ڕێزیان نامێنێت و سەرپەرشتی و گوێڕایەڵی کردنیان پشتگوێ دەخرێ، لەبەرامبەردا گەورەی ومافی بڕیار دان تەنها بۆ زۆرینە دەمێنێتەوە ، لەهەر ئاست و پلەیەکدا بن .

٣٥) وە هۆکارە بۆ دورەپەرێزی و بایەخنەدان بە خوێندنی زانستە شەرعیەکان و حاڵیبوون لە دین, و سەرقاڵبون بە شتانی لاوەکی و بێ سودەوە .

٣٦) دەبێتە مایەی لە کارخستنی ئیجتیهاد و بێ هودەی کۆشش و گەڕان بەدوای ڕاستییەکاندا، چونکە لەتەرازوی دیموکراتیدا شوێن کەوتوو شوێن کەوتە(مجتهد و مقلد) بونی نیەو، هەمووان بە موجتەهید دادەنرێن بێ گوێدانە ئامرازەکانی ئیجتهادوو تێرامان لە دەقە شەرعیەکان.

٣٧) هەندێ جار سەردەكێشێت بۆ سەركوتكردن و لێدانی بزاڤە ئیسلامیەكان بە هۆی چونەنێو مەیدانی كێبڕكێ و كێشمەكێشم لەگەڵ بەرامبەرەكانیان، ئەمەش بێ بونی هێزی پێویست و ئامادەكاری بۆ ئەو ڕوبەڕوو بونەوانە .

٣٨) ئەو بانگخوازانەی ڕێگەی دیموكراتیان گرتۆتەبەر بە ئامانج و هیوای پیادەكردنی حوكم و دادی خوای لەم ڕێگەوە، بە دڵنیاییەوە جگە قایل بون بە (حوكمی گەل) نەبێ بە هیچ ئامانج و هیوایەكی دی ناگەن، ئیدی بەو ڕێگە و كارەیان ئامانجەكەیان بە تاڵ دەكەنەوە و ، سەرەنجامەكەش پێچەوانە دەبێتەوە .

٣٩) دیموكراتی وەك شەمامعەیەك گەلی پێ چەواشە دەكرێت، بە جۆرێك وا حاڵی دەكەن كە حوكم ڕانی خۆیدەكات و هەرخۆشی خاوەنی بڕیارە لە چارەنوسی خۆی، بەڵام دیارە كە ڕاستییەكەی بە پێچەوانەوەیە.

٤٠) ئەم ڕێگەیە هۆکارێکە بۆ بەزایەدانی هەوڵ و کۆششی زانایان و بانگخوازان، لادان و سەرقاڵکردنیانە لە واجبی پەروەردەکردنی ئوممەت و, یەکلابونەوە بۆ بانگەواز و هۆشیار کردنەوە و فێرکردنی خەڵکی لە ئاینی ئیسلام.

٤١) لەخراپەکانی دیاری کردنی دەسەڵات بە زەمەن و کاتی دیاری کراوەوە، بە جۆرێك گەر وادەی دیاریکراو کۆتای هات دەبێت دەسەڵاتدار دەست لە کاربکێشێتەوە بۆ کەسانی دی گەرنا دەبێتە مایەی سەرهەڵدانی ناکۆکی و جیاوازیەکان، دەکرێت ئەو کەسەی وادەی دەسەلاتی تەواو دەبێت شیاو تر و دڵسۆز تر بێت لەوەی جێگەی دەگرێتەوە، دیارە بوونی ڕژێم و حاڵەتی لەو جۆرە دەرگای ئاژاوەو و فیتنە و یاخیبوون لە دەسەڵات دەکاتەوە ، وە ئاشکرایە کە یاخیبون و دەرچون لە دەسەڵات و حوکمڕەوایانی تەنها لە کاتی هەبونی کوفری ئاشکرادا نەبێت دروست نییە, ئەوش لەگەڵ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی و هەبونی توانای پێویست لەو حاڵەتەدا.

٤٢) ئەنجومەنی نوێنەران ئەنجومەنێکی هاو بەش بڕیاردانە بۆ خوا و دەرچونە لە فرمانەکانی. بۆیە دەبینین لەو ئەنجومەنەدا باوەڕ بە حوکم و حاکمەیەتی زاتی پەروەردگار ناکرێت، ئیدی بۆیە مانەوەو دانیشتن لەو جێگە لەگەڵیان بە هیچ شێوەو ئامانجێك دروست نی یە ،بە فەرمانی خوا کە دەفەرموێت : (وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آَيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا) ١٤٠النساء. یانی: وەبێ گومان خوا ناردوویەتییە خوارەوە بۆتان لەقورئاندا هەر کاتێك بیستان بەڵگەو ئایەتەکانی خوا بڕوایان پێ ناکرێت و گاڵتەیان پێدەکرێت ئەوە دامەنیشە لەگەڵیاندا تا باسەکە دەگۆڕن.

بێگومان گەر دانیشتن لەگەڵیاندا و هاوبەشیان بکەن ئەوە ئێوەش وەك ئەوانن, بەڕاستی خوا کۆکەرەوەی دووڕوەکان و بێ باوەڕەکانیشە بە تێکرا لە دۆزەخدا.

وە بە فەرمانی ... (وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آَيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ) الانعام (٦٨) یانی: هەرکاتێ ئەوانەت

دی قسەی ناشایستە دەکەن لەمەر ئایەتەکانی ئێمە ئەوە روو وەرگێرەلێیان تادەچنە سەر باسێکی تر

٤٣) لە ناوەڕۆکدا ، تانەدانە لە زاتی خواو دانای و حیکمەتی لە بڕیار و تەشریعدا، ئەم ڕاستیەش لە چەند ڕویەکەوە ڕون دەبێتەوە .

ڕوی یەکەم: زاتی (الله) پێغەمبەرانی (علیهم السلام) ڕاسپاردووە و, گوێرایەڵی کردنیشیانی لەسەر خەڵك پێویستکردوە ، وە بە سوتاندن و لەناوبردن هەڕەشەشی لەوانە کردوە کە شوێنیان ناکەون، وە هەروەها پەراو کتێبیشی نازڵکردووە هەتا حوکمڕان و دادوەری حاڵی خەڵکبن ، (حەرام و حەڵاڵ و واجب و سوننەت و مەکروە و مەدح و زەم و عیزەت و زەلیلی) داناوەو دیاری کردووە، خەڵکانێکی بڵندوبەرێزو و خەڵکانیکی دی زەلیل ونەوی کردووە، بێ بە هەند وەرگرتنو ڕەچاوکردنی ئارەزو و ویست و حاڵی خەڵکانی نەیاری پەیامی پێغەمبەران (علیهم السلام) بەڵکە تەنانەت پێغەمبەران (علیهم السلام) کە ڕاسپێردراون زۆرینەی خەڵکی ـگەر نەڵێین هەمووی_ لە گومڕای و نەفامی و کوێرەوەری دا بون، ئیدی گەر دیموکراتی و حوکمڕانی

گەل بە گەل هەق و ڕەوابوایە، ئەم بڕیار و شێوەکارە هەمووی بێ هودە و گاڵتەجاری بووە، کە خوای پاکو بێ گەرد دوورە لێیەوە .

ڕوی دووەم: دەگوترێت: گەر دیموکراتی حەق و ڕەوا بێت، ناردنی پەراوە ئاسمانیەکان و ڕەوانە کردنی پێغەمبەران (علیه السلام) ستەم و ڕاسەپاندن و زەوتکردنی مافی خەڵکییە لە حوکمڕانی خۆیان بۆ خۆیان!! بێ گومان خوای باڵادەست بێ نیازە لە زوڵم و ستەم .

ڕوی سێیەم: گەر دیموکراتی هەق و ڕەوابێت ، ئەوە حوکمەکانی جیهاد و جزیە و کۆیلایەتی و ڕژانی خوێنی بێ باوەڕان دوژمنانی ئەم دینە هەموی زوڵم بوە دەرهەقیان کراوە و بە زایەدانی ڕاو بۆچونە_چەوتە_کانیان بوە ، ئەمەش لە خۆیدا تانەدانە لە بڕیار و تەشریعاتی خوای پاك و بێگەرد.

لە ڕویەکی دیکەوە: گەر دیموکراتی هەق و ڕەوابوایە، ئیبلیسی نەفرەتی لە بەهەشت دەرنەدەکراو، نەتەوەی نوح (علیه السلام) تیا نەدەبران, فیرعەون و شوێنکەوتوانی نەدەخنکێنران , وە ئەوەی بەسەر نەتەوەکانی پێغەمبەرانی (علیهم السلام) خوا (صاڵح و هود و شعیب_ علیه السلام_) هات لەخاپور و لە بەینبردنیان نەدەبوو، گەر دیموکراتی

ڕەوابوایە ئەوەی بەسەریان هات زوڵم و ستەم بوو لییێان کرا، چونکە لە ڕاستیدا سزای خوا بۆ ئەوان بە هۆی بیرو ڕاو باوەڕی خراپ و نەشیاویانەوە بوو.
لە ڕویەکی دیکەوە: گەر دیموکراتی پەیڕەوێکی ڕەوا بوایە ، ئەوە حوکمی خوا لە مەڕ ڕەجمی زیناکەری پیاو و ژن و, شەلاق لێدانی کوڕو کچ و. شیلاق لێدانی عارەق خۆر و, کوشتنی پاشگەزەوە بوو، هەموو ئەمانە کاری قێزەون و وەحشی گەر و دڵڕەقین و ,پێچەوانە و سەرپێچی مافەکانی مرۆڤ و ئازادی تاکەکانە،وەك دەڵێن. (كَبُرَتْ كَلِمَه تَخْرُجُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ إِنْ يقُولُونَ إِلا كَذِبًا) یانی: چ بوختانێکی گەورەیە کە لەدەمیان دەر دەچێت , ئەوانەجگە لە درۆ هیچ شتێکی تر ناڵێن.
وە پاك وبێگەردی وبەرزی بۆ خوا لە وەی زاڵمان بە لوتبەرزیانەوە دیلێن .

٤٤) له سایەی سێبەری دیموکراتیدا داهێنراوەکان (البدع) و, گومڕاییەکان (الضلال) بە هەموو جۆر و ڕێچکەکانیانەوە دەژێنەوەو, بانگەشەکەرانی بە دیار دەکەون و ئاشکرایانە بانگەواز بۆ گومڕای دەکەن، وەك مەزهەب و کۆمەڵە گومڕاکانی (شیعە و موعتەزیلەو باتنیەکان و سۆفی و مورجیئەکان .... هتد) بەڵکو لە سایەی دیموکراتی دا هەموو ئەوانە هاوکاری وهاندان و دەست لە پشتیان بۆ هەیە لە لایەن مونافیقانی ناوخۆ و دۆستانی دەرەوە تاکو حوکمی الله پەك دەخەن وەك و ئێستا.

٤٥) لە بەرامبەریشدا تانەو پڕوپاگەندەو تۆمەتی نەشیاو بۆ بانگخوازانی ڕێگەی خوا هەڵدەبەسرێت، و سومعە و ڕێزیان لای خەڵکی لەکەدار دەکرێت ، وە لە بارەیانەوە دەگوترێت، ئەوانە ماڵ و دونیا ویستن و کارییان بۆ پلەو پایەو کورسییە و بە کرێ گیراون .... چەندین تۆمەتی دروستکراو ئامادەکراو ی لەم شێوەیان بۆ دەخرێتە کار، بەهۆی ئازادی ووتە و ڕادەربڕین . وە تانەدان لە ناموسی خەڵکانی تر.

٤٦) ئەم ڕێگەیە زۆر جار سەر بۆ ئەوە دەکێشێت کە ڕێبوارانی یەکڕیز و هەڵوێست ڕاوەستن لەگەڵ لایەنە پاشگەزەوەبوو زەندیقەکان بۆ بەرگریکردن لە بنەما جاهیلیەکانی سەردەم،وەك (پەیماننامەی نێودەوڵەتی) و (ئازادی ڕۆژنامەگەری) و (ئازادی ڕادەربڕین) و (نیشتمان پەروەری و نەتەوەیی )و هاوشێوەکانیان.

٤٧) دیموکراتی هۆکاری سەرەکیە بۆ داڕمانی ئابووری و گەمەو گاڵتەکردن بە ماڵی گشتی، چونکە میزانیەی دەوڵەت لەلایەن پارتەکانەوە بە تاڵان دەبرێ.

بە پاسا و بەهانەی کردنەوەی بارەگا و ,ئەنجامدانی پڕوو پاگەندەی هەڵبژاردن بە شێوەی خوازراو هاوچەرخ ، وە بەکارهێنانی بەمەبەستی دەم چەورکردنی خەڵکی و کڕینەوەی دەنگەکانیان.

٤٨) دیموکراتی تێکەڵی دروست دەکات لە نیوان ڕەواو نا ڕەواو (الحق والباطل) و جاهیلیەت و ئیسلام و زانست و نەفامیدا.

٤٩) دیموكراتی مۆرك و هێمای ئومەتی ئیسلامی دەسڕێتەوەو, كەسایەتی ناهێڵێت و ,تایبەتمەندیەكانی دەپوكێنێتەوە، لە میانەی لۆمەكردنی دینی خوا بە بەهانەی ئەوەی لەگەڵ ئەم سەردەمەدا ناگونجێت و لەگەڵ داخوازییەكانی خەڵكداڕێناكات، وە لەمیانەی ناشیرینكردن و ڕوشاندنی مێژوی حوكمڕانی ئیسلامی، كە گوایە رژێمێكی دیكتاتۆری بووە و دیموكراتی تێدا نەبووە، لەسەرو هەموو ئەمانەوە شوێنكەوتەی تەواوی ئوممەت بۆ ڕۆژئاوای جولەكەو خاچپەرستانی ڕق لە دڵ.

٥٠) پەیڕەوی دیموكراتی هۆكاری باری نائارامی و دروستبونی قەیرانە لە وڵاتدا, هۆی سەرهەڵدان و دروستبوونی كێشەی نێوان پارتەكانیشە ، بە جۆرێك لە هەر وڵاتێكدا دیموكراتی پەیڕەو بكرێت لەگەڵیدا ترس و دڵە راوكێی و كێشەكانی تایفەگەری و بیر و باوەڕی و خێڵەكی و بەرژەوەند پەرستی پەیدادە بێت و یەخە بە خەڵكەكەی دەگرێت جگە لەمانە ئەو هەموو نائارامی و ناكۆكیانەی كە هەموان پێی ئاشنا بوون لە سایەی دیموكراتیدا!!.

ئەوەی شیاوی وتنە بە دەستهێنانی ئەو ئەندازە بەرژەوەندییەی لە میانەی پەیڕەویکردنی دیموکراتی و هەڵبژاردندا بەدی دێت ، دەبینین هەمووی بەرژەوەندی بەشی (جزئی) و خەیاڵ پڵاوی و هیچ بەهایەکی ئەوتۆیان نییە گەر بمانەوێت بەراوردیان بکەین لەگەڵ هەندێ لەم زیان و خراپانەی باسمان کرد.. ئیدی دەبێت چۆنبێت گەر بەراوردی بکەین لەگەڵ ئەم هەموو خراپە و مەفسەدانەدا.!!.

ئەوەی بە دیقەت و تێرامانەوە سەیری هەندێ لەو خاڵانەی سەرەوە بکات، بە ڕاشکاوانە خوارو خێچی ئەم ڕێچکە تاغوتیەی بۆ بەدیار دەکەوێت، ئەوسا دەزانێت ئاستی جودای و دووری لەگەڵ دینی خوادا چەندە.

بەڵکو دەزانێت کە دیموکراتی قێزەونترین و ترسناکترین مەزهەب ورێچکەو ڕژێمە لەسەر زەوی پیادە دەکرێت و ، دایکی کوفر و بێ باوەڕییە، بە شێوەیەکی وا دەگونجێت هەموو ڕێڕەو و مەزهەبەکان لە سایەیدا کۆببنەوە, لە جولەکەو خاچپەرست و ئاگر پەرست و بت پەرست و هیندۆس و موسوڵمان. دەبینین هەموان لە تەرازوی دیموکراتیدا خاوەنی ڕای ڕێز لێگیراون و, دەرگا بە ڕویاندا ئاوەڵایە و،

مافی بانگەشەیان بۆ بیرو باوەڕ و بۆچونەکانیان دەستەبەرە، بە هەر ڕێگە و هۆکارێك بیانەوێ ، ئیدی ئەوەندە بەسە بۆ دەرچون لە دینی ئیسلام.

وەجێگەی سەرسورمانە لە پاش هەموو ئەمانە دەوترێت (دیموکراتی و ئیسلام پێکدێنەوە ) یان ( ئیسلام ڕژیمێکی دیموکراتیە) وەك هەندێ لەوانە دەڵێنکە کارو بانگەوازی ئیسلامی پێیانەوە گیرۆدەبووە.

و حسبنا الله ونعم الوکیل ...